# قەدەغەکراوەکان المنهيات

# لە

# فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ



دووەم چاپ
2011-هەواێر

حەوێز حاجی علی

# ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: قەدەغەکراوەکان (المنهیات) لەفەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ)

بابەت : فەرموودە

ئامادەکردنی : حەوێز حاجی عەلی

کۆمپیوتەر : نووسینگەی هیوا

چاپی : دووەم چاپ ٢٠١١

شوێنی بڵاوکردنەوە: ((کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی))

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (     )ی ساڵی(     )ی پێدراوە.



# قەدەغەكراوەكان

# (المنهيات)

## لەفەرموودەكانی پێغەمبەر (ﷺ)

ئامادەكردنی

حەویز حاجی عەلی

دووەم چاپ

٢٠١١

# پێشەکی

الحمد لله وكفى وصلى الله على النبي المصطفى (ﷺ).

اما بعد....

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ:((**ما نهيتكم عنه فاجتنبوه وما امرتكم به فاتوا منه ما استطعتم**)) البخاري ومسلم.

لەم فەرموودە پیرۆزدا پێغەمبەر(ﷺ) داوا لەهەموو موسڵمانان دەکا کەئەوەی من قەدەغەم کردووە نەیکەن وەئەوەی منیش داوام لێکردن جێ بەجێی بکەن، دەبێ جێ بەجێی بکەن بەپێی تواناناتان.

ئێمە دەبێ پابەندی هەموو داخوازییەکانی خوای پەروەدگار بین، چونکە خوای گەورەو میهرەبان کەشتێك قەدەغە دەکات لەبەر خراپی و نارێکی کارەکە قەدەغەی دەکات، بۆ نموونە کەدەفەرمووێ: (ولاتقربوا الزنا) یاخود دەفەرمووێ: ( ولاتاكلوا مما لم يذكر اسم الله عليه)، ئەمە هەمووی لەبەرژەوەندی بەندەکانی خۆیەتی.

جا لەکۆتاییدا داواکارم لەخوای پەروەردگار ئەم کارەم لێ وەربگرێ کەبریتییە لەزۆرێك لەو فەرموودانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کردووە[1] لەموسلمانان، بیکا بەتوێشووی رۆژی دوایی. (امین)

**حەوێز حاجی عەلی**

٢٠٠٦/٣/٢٠

---

(١) بەپشتیوانی خوای گەورە بابەتێکی تێروتەسەل و فراوان لەسەر (النهی) نزیکی تەواو بوونە انشاء الله لەدەرفەتێکدا چاپی دەکەین.

**(١) عن أبي هريرة ﷺ قال: نهى رسول الله ﷺ عن صيام ستة أيام: يوم الفطر ويوم النحر ويوم شك فيه من رمضان وثلاثة أيام بعد النحر.**[1]

واتـه: پێغەمبەرﷺ ڕۆژووی ئەم شەش ڕۆژەی قەدەغە کردووە، ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و ڕۆژی جەژنی قوربان، وە ڕۆژێك کە گومانت هەبێ ڕەمەزانە یان نا، وە سێ ڕۆژ دوای یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان.

**(٢) عن ابن عمرﷺ قال: سمعت رسول الله ﷺ نهى النساء في إحرامهن عن القفازين والنقاب وما مس الورس والزعفران من الثياب ولتلبس بعد ذلك ما أحبت من ألوان الثياب معصفرا أو خزا أو حليا أو سراويل أو قميصا أو خفا.**[2]

واته: کوڕی ئیمامی عومەرﷺ (ڕەزای خوای لەسەر بێ) فەرمووی: گوێم لێبوو کە پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کرد لەوەی کە ژن لەکاتی ئیحرامدا دەستکێش و پەچە و جلی وەرساوی و زەعفەرانأوی بەکار بهێنێ، ئەمانەی لێ دەرچێ ئیتر ژن حەزی لە چ چەشنە جلێکی ترە با لەبەری بکا، وەك عەصفەراوی و ئاوریشم و خشڵ و دەرپێ و کراس و خوف(گۆرەوی).

---

١ رواه الدار قطني: ١٠٧/١، رواه الشيخان وابوداود والترمذي والنسائي، انظر تاج الأصول لشيخ منصور على ناصف الجزء الأول باب الأيام المنهي عن صيامها.

٢ رواه أبوداود والترمذي والنسائي والأحمد، انظر تاج الأصول باب فيما يحرم على المحرم.

(٣) عن جابرﷺ قال: نهى رسول الله ﷺ عن ثمن الكلب ومهر البغي وحلوان الكاهن.[1]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە بەها و نرخی سەگ و کرێی ژنی داوێن پیس و لەمز (واتە سەرقەڵەمانەو کرێی کاهین و فاڵچی).

(٤) عن جابرﷺ قال: قال نهى رسول اللهﷺ عن ثمن الكلب والسنور.[2]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە بەها و نرخی سەگ و پشیلە.

(٥) عن ابن عمرﷺ قال: نهى رسول الله ﷺ عن عسب الفحل.[3]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە کرێی پەڕینی نێر لەمێ (هەروەك ئێستا لەناو شارەکان یەکێك جوانەگایەك یا بەرانێکی چاك ڕادەگرێت بۆ ئەوەی پارەی پێ وەرگرێت).

(٦) عن ابي هريرةﷺ قال: نهى النبيﷺ عن بيع الحُساة وعن بيع الغرر.[4]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە فرۆشتنی بەردەهاوێژ(بيع الحصاه) و لە فرۆشتنی شتی نەزانراو و دەست نەداو وەك چۆلەکە بە ئاسمانەوەو ماسی لەناو ئاودا، یا شتی بزر بوو.

---

١ رواه مسلم وابوداود واالترمذي والنسائي والبخاري.

٢ رواه مسلم وابوداود واالترمذي والنسائي

٣ رواه البخاري و وابوداود واالترمذي والنسائي

٤ رواه مسلم وابوداود واالترمذي والنسائي

**(٧) نهى رسول الله ﷺ أن يبول الرّجل وهو قائم.** [١]

واته: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لەوە کە پیاو بە ڕاوەستانەوە میز بکات.

**(٨) نهى النبي ﷺ أن يستنجي بروثة أو بعظم.** [٢]

واتە: پێغەمبەر ﷺ قەدغەی کردووە کە خۆمان پاك بکەینەوە بە پاشەڕۆکی ئاژەڵ(ریخ) یا بە ئێسك.

**(٩) نهى رسول الله ﷺ أن يباشر الرجل الرجل، والمرأة المرأة لا ثوب بينهما.** [٣]

واته: پێغەمبەر ﷺ ڕێگای نەداوە پیاو و ئافرەت بەڕوتی یەکتر ببینن هیچ پۆشاکێك لەنێوانیاندا نەبێت.

**(١٠) نهى النبي ﷺ أن يُقضي الرجل حاجته على ضفة نهر.** [٤]

واته: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لە پیسایی کردن لە سەر ڕۆخی ڕووبارەکاندا.

**(١١) عن جابر بن عبدالله رضي الله عنه أن النبي ﷺ نهى عن محاش النساء.** [٥]

واته: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لێمان کە لەدواوەی ئافرەت جماع

---

١ رواه ابن ماجة:: حديث رقم ٣٠٩.

٢ فتح الباري: ٢٥٦/١ ، وقال ابن حجر رواه الدار قطني ايضا.

٣ رواه احمد: ٣٠٤/١ و ٣٥٦ والطبراني في الصغير ٢٣٣/١ ، و ابن ابي شيبة: ٣٩٨/٤ ، مجمع الزوائد: ١٠٢/٨، وقال اسناده صحيح.

٤ رواه الخطيب البغدادي، انظر تأريخ بغداد للخطيب: ٢٥٦/٨.

٥ رواه الطبراني في الأوسط ورواته ثقاة.

بکرێت.

**(١٢) نهى رسول الله ﷺ عن الشرب في آنية الفضة.** [١]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە خواردنەوە لەناو دەفری زیودا.

**(١٣) نهى النبيﷺ عن لبستين ان يشتمل الرجل في الثوب الواحد ليس على فرجه منه شيء وان يشتمل الرجل بالثوب الواحد ليس على شقيه وعن ملامسة والمنابذة.** [٢]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لەو جۆرە جلوبەرگەی کە لایەك دادەپۆشێ و لایەکی تر دەردەخات، ئەگەرلای ڕاست داپۆشێ لای چەپی دەردەکەوێ (وە بەپێچەوانەوە).

**(١٤) نهى رسول الله ﷺ أن يبال في المغتسل.** [٣]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لەوەی میز بکرێ لە شوێنی خۆشوشتن (واتە حمام).

**(١٥) نهى النبيﷺ عن البول في الماء الراكد.** [٤]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە میزکردن لەناو ئاوی وەستاودا.

**(١٦) نهى رسول الله ﷺ أن يبول مُستقبل القبلة.** [٥]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە میزکردن ڕووەو ڕووگە(قبلة).

---

١ رواه البخاري، ٩٩/٧ ، مسلم: ٥ ، مسند أحمد : ٣٩٦/٥.

٢ رواه البخاري ، انظر فتح الباري: ١٠ / ٢٧٩.

٣ شرح السنة : ١ / ٣٨٤.

٤ رواه النسائي : ١/ ١٩٧ ، وأبن ماجه: ٣٤٣ .

٥ رواه ابو داود : ١/ ٢ و ٣ ، فتح الباري: ١/ ٢٤٦.

**(١٧) عن أبي جحيفة قال: نهى النبي ﷺ عن ثمن الكلب وثمن الدم وثمن الواشمة والموشومة وآكل الربا وموكله ولعن المصور.** [(١)]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە بەهاو نرخی سەگ و بەهای خوێن و کرێی خاڵکووت وەربگیرێ، وە رێگەی نەداوە ژن خاڵ بکوتێ بۆ خۆی، هەروەها رێگەی سووخۆر و (ریبا) سوودەری نەداوە، وە نەفرینی (لعنە) لە وێنەگر کردووە (واتە ئەو وێنانەی کە مجسم بن، بەڵام وێنەی فۆتۆگرافی لەبەر زۆر گرنگی رێگەی پێدراوە، واتە ئەویان مجسم نیە).

**(١٨) عن جابرﷺ قال: نهى النبيﷺ عن بيع الصبرة من التمر لا يعلم مكيلها بالكيل المسمى من التمر.** [(٢)]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە فرۆشتنی کۆمەڵێ خورما لەگۆترە بە ئەندازەی کۆمەڵێ خورمای تر کە پێونەی زانراوبێ وەك ئەوە گەلێ کەس دەڵێن: ئەم کۆمەڵە گەنمە هێشتا نەپێوراوە لەسەر من بە بیست ریە.

**(١٩) عن ابي المنهالﷺ قال:... نهى رسول الله ﷺ عن بيع الورق بالذهب ديناً.. وفي رواية: إن كان يداً بيد فلا بأس وإن كان نسيئة فلا.** [(٣)]

---

١ رواه البخاري

٢ رواه مسلم والنسائي

٣ رواه مسلم والبخاري.

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە فرۆشتنی زیو بەزێڕ بەقەرز، بەڵام ئەگەر دەست بەدەست بێ قەیناکا، بەڵام ئەگەر دەست بەدەست نەبوو بەهیچ جۆرێك نابێ.

(٢٠) **عن سعد رضي الله عنه قال: كنا نكري الأرض بما على الشواقي من الزرع فاختلفوا فنهانا رسول الله ﷺ عن ذلك وأمرنا أن نكريها بذهب أو فضة.** [١]

واتە: لەپێشدا زەویمان دەدا بەکرێ، بەم شێوەیە: ئەوەی کە لەسەرماکاوو قەد و تیر و جۆگەلەکان دەڕوێ بۆ ئێمەبێ و ئەوی تریشی بۆ وەرزێر بێ، جا گەلێ جار دەبوو بە ناکۆکیمان، لەبەر ئەوە پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کرد لێمان، وە فەرمانی پێکردین کە بەزێڕ و زیو بیدەین بەکرێ.

(٢١) **نهى رسول الله ﷺ عن التبتل نهيا شديدا...** [٢]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە ڕەبەنی و ژننەهێنان.

(٢٢) **عن ابن عباس رضي الله عنه يقول: إن النبي ﷺ نهى عن طعام المتبارين ان يؤكل.** [٣]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە کە نانی ئەو کەسانە بخورێ کە بۆ چاولێکەری و شانازی نان دروست دەکەن.

(٢٣) **عن جابر رضي الله عنه قال: نهى رسول الله ﷺ أن يطرق الرجل أهله**

---

١ رواه ابوداود بسند جيد

٢ رواه أحمد وابن ماجه بسند حسن، الدر المنثور، ٢/٣١٠ ، ٤/٦٥.

٣ رواه ابوداود بسند جيد

**ليلاً يتخونهم أو يلتمس عثراتهم.**[1]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە کە پیاو بەشەو لەناکاودا بچێتەوە ماڵ، مەبەستی ئەوە بێ کە ژنەکەی تاقی بکاتەوە، تا بزانێ ناپاکی لێدەکا یان نا، یا لە هەڵەو سەرسمی بگەڕێ.

**(٢٤) عن جابر ﷺ قال: نهى النبي ﷺ عن بيع الثمر حتى يطيب ولا يباع شيء منه إلا بالدرهم إلا العرايا.**[2]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە فرۆشتنی بەری دارودرەخت تا خۆش نەبێ و بەکەڵکی خواردن نەبێ، وە هیچی لێ نافرۆشرێ مەگەر بەپارە، جگە لە دارەڕۆخە.

عەرایا: ئەوەیە کە دەوڵەمەندێك دارێك، دووان دەدا بە هەژارێ، تا بەرەکەی بخواو لەپاشا دارەکە هی خۆیەتی، جا لەپاشا بۆ بارسووکی بەرەکەی لێدەکرێتەوە بەخورما ئەگەر هەوەستیان لێبوو.

**(٢٥) عن سهل بن أبي حثمة قال: أن رسول الله ﷺ نهى عن بيع الثمر بالتمر وقال ذلك الربا تلك المزابنة إلا أنه رخص في بيع العرية النخلة والنخلتين يأخذها أهل البيت بخرصها تمرا يأكلونها رطبا.**[3]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە فرۆشتنی بەر بە دارخورماوە بە خورمای ووشك، وە فەرمووی: ئەوە سووە (واتە ریبایە)، وە بەم

١ رواه مسلم

٢ رواه البخاري وأبوداود.

٣ رواه البخاري ومسلم وأبوداود والترمذي والنسائي.

جۆره سەودایە دەگوترێ (موزابەنـە)، بـەڵام پێغەمبـەرﷺ ڕێگـەی (بیـع العرایـا)ی داوە، کـە بریتییـە لـە یـەك دوو دار خورمـا دەوڵەمەندێك دەیدا بە مـاڵێکی هـەژار بەرەکـە بخۆن، لەپاشا بـۆ بارسووکی هـەردوولا، خاوەنەکـەی دەیخـەملێنێ بـە خورمـاو لێـی دەکڕێتەوە بەقەد خەملەکە خورمای دەداتێ جا خـۆی بـە ڕووتـابی دەیخوا.

(٢٦) عن جابرﷺ قال: نهى رسول اللهﷺ عن المحاقلة والمزابنة والمعاومة والمخابرة وعن الثنيا ورخص في المرايا.[1]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغـەی کـردووە لـە فرۆشـتنی قەرسـیل و شـینایی نـەدووراوە بەدانەوێڵـە بەپێوانـەی دیـاریکراو، وە لـە فرۆشـتنی بەرسیلەکاری وەك روتاب و ترێ بەسەر دارەوە بە خورمـا و مێـووژ بە پێوانەیەکی دیاریکراو، وە لە فرۆشـتنی درەخـت بـەوادەی چـەند ساڵێك کە کاتەکە تـەواو بـوو درەختەکـە ببێتـەوە بـەهی خاوەنـە پێشووەکەی.

مخابزە: میکانەکاری: بریتییـە لـەوە کـە یـەکێ پارچـەیەك زەوی بـدا بـە کەسێك کە خۆشی بکاو، دایچێنێ بـە ملکانـە بـە نیوەکـاری، یـا بەکەمتر یا بەزیاتر.

الثنیا: واتە استثنا: چەرتکردن: بریتییە لـەوەی کـە تـۆ شـتێ بفرۆشـی و بەشـێکی نـەزانراوی لێ جیابکرێتـەوە، وەك ئـەوە بڵـێ: ئـەوا ئـەم کۆمەڵە گەنمەم پێ فرۆشتیت هەندێکی نەبێ.

---

١ رواه البخاري ومسلم وأبوداود والترمذي

**(٢٧) سئل رسول الله ﷺ عن شراء التمر بالرطب، فقال : أينقص الرطب إذا يبس؟ قالوا نعم. فنهى عن ذلك.** [١]

واتە: پرسیارکرا لە پێغەمبەرﷺ لەبارەی کڕینی خورما بە ڕوتاب، فەرمووی: ئایا ڕووتاب کە ووشك بۆوە کەم دەکا؟ گوتیان: بەڵێ کەم دەکا، پێغەمبەریشﷺ قەدەغەی کرد.

**(٢٨) نهى النبي ﷺ عن اليمين الكاذبة.** [٢]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە سوێندی بەدرۆ بخۆین.

**(٢٩) نهى رسول الله ﷺ عن اجابة الفاسقين ومجالستهم ومحادثتهم.** [٣]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە، وەڵامی فاسقەکان (ئەوانەی کە لە بەرنامەی خوا چوونەتە دەرێ) بدەینەوە، یا لەگەڵیان دابنیشین، یا گفتوگۆیان لەگەڵ بکەین.

**(٣٠) نهى النبيﷺ عن الغناء، وعن الاستماع الى الغناء.** [٤]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە گۆرانی ووتن (ئەو گۆرانییانەی کە هانی خەڵکی دەدەن بۆ چاکەکردن و بەرگری کردن لە خراپە، ئەمانە ناگرێتەوە) وە گوێگرتن لە گۆرانی.

---

١ رواه أبوداود والترمذي والنسائي بسند صحيح.

٢ رواه البخاري ١٤٥/٣ ، ٤٣/٦ ، ١٧١/٨ و ١٧٢ ومسلم ، الإيمان: ٢٢ ، وشرح السنة: ١ز:٩٩ ، مسند أحمد : ٤٤٣/١ ، وفتح الباري: ٢١٣/٨، رر/٢٥٨.

٣ رواه الطبراني في الكبير: ١٨/ ١٦٨ .

٤ تأريخ بغداد للخطيب: ٢٢٦/٨.

(٣١) نهى رسول اللهﷺ عن لبس القسي.[١]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە پیاو جلی سوور لەبەر بکا، لەبەر ئەوە لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێ: (الحُمر زينة الشيطان) رواه احمد ٤/٩٢.

(٣٢) نهى النبيﷺ عن تعليق التمائم.[٢]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە موسڵمان نووشتە بەخۆیەوە بکات.

(٣٣) نهى النبيﷺ عن الرنّة.[٣]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە قیژە لەکاتی ناخۆشیدا.

(٣٤) نهى رسول الله ﷺ عن النياحة.[٤]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە بەدەنگی بەرز لەسەر مردوو بگرین و کاری ناڕێك و نەشیاو ئەنجام بدەین.

(٣٥) نهى رسول اللهﷺ عن الكذب.[٥]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە درۆکردن.

(٣٦) نهى النبيﷺ عن الغيبة والأستماع الى الغيبة.[٦]

واته: پێغەمبەری خوا ﷺقەدەغەی کردووە لە غەیبەت کردنی یەکتر و گوێگرتن بۆ غەیبەت.

---

١ رواه البيهقي: ٢/٨٧ ، وابوداود: لباس: ١١ ، الترمذي: رقم ٢٦٤ ، بدائع المنن ١٧٧٥ .

٢ الترغيب والترهيب: ٤/٣٠٦ ، البيهقي: ٩/٣٥٠ ، موارد الظمآن: ١٤١٣

٣ شرح السنة: ٥/ ٤٣١.

٤ مجمع الزوائد: ٣/١٤ بسند حسن.

٥ رواه مسلم: ٤/٢٠١٣ ، وأبوداود: ٨٧ ، ومسند أحمد: ١/ ٤٣٢.

٦ تأريخ بغداد للخطيب : ٨ / ٢٢٦.

**(٣٧) نهى النبيﷺ عن النظرة الثانية.**[١]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووین بۆ جاری دووەم سەیری ئافرەت بکەین (واتە جاری یەکەم قەیناکا، بەڵام بۆ دووەم جار لەسەرت دەژمێردرێت) کە لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرمووێ: ((النظرة الأولى لك والثانية عليك)).

**(٣٨) عن ابن عمر رضي الله عنه قال: نهى النبيﷺ عن النجش.**[٢]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کرد لە پێداهەڵگووتن و کۆستەکۆستە و زەمی درۆ بۆ هەڵخەڵەتاندن و تەفرەدانی کڕیار.

**(٣٩) عن انس بن مالك رضي الله عنه قال: نهى النبيﷺ عن بيع الثمرة حتى يبدو صلاحها عن النخل حتى يزهو، قيل: وما يزهو؟ قال: يحمارّ أو يصفارّ.**[٣]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە فرۆشتنی بەری درەخت و شینایی تا پێدەگا و بەکەڵکی خواردن دێ، وە قەدەغەی کردووە لە فرۆشتنی خورمایش تا ماتە دەدا، گوترا ماتە یانی چی؟ گوتی: یانی سوور ببێ، یا زەرد ببێ (واتە پێبگات).

**(٤٠) عن ابن عمر رضي الله عنه قال: نهى رسول اللهﷺ عن بيع النخل حتى يزهو وعن السنبل حتى يبيض ويأمن العاهة نهى البائع**

---

١ رواه البخاري ومسلم .

٢ رواه البخاري ومسلم وأبوداود والترمذي والنسائي.

٣ رواه البخاري ومسلم وأبوداود والترمذي والنسائي.

**والمشتري.**[1]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە فرۆشتنی خورما بە دارەوە، بەر لەوەی کە زەرد یا بوو بێ، وە لە فرۆشتنی دانەوێڵە لەناو گوڵەکەی دا بەر لەوەی کە سپی هەڵگەڕێ و لە دەرد و بەڵای ئاسمانی ڕزگاری ببێ، قەدەغەی کردووە لە کڕیار و فرۆشیار.

**(٤١) عن ابن عمر رضي الله عنه قال: نهى رسول الله ﷺ عن بيع العنب حتى يسودّ وعن الحبّ حتى يشتدّ.**[2]

واتە: قەدەغەی کردووە لە فرۆشتنی ترێ تا ڕەش دەبێ (یا تا پێدەگا بۆ ئەو ترێیەی سپییە) وە فرۆشتنی دانەوێڵە بە سەوزی تا دەنکەکەی تەواو ڕەق دەبێ.

**(٤٢) عن ابن عمر رضي الله عنه قال: نهى النبي ﷺ عن بيع الرجل على بيع اخيه، ولا يخطب على خطبة أخيه، إلاّ ان يأذن له.**[3]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە، فرۆشتن و سەودا لەسەر فرۆشتن و سەودای برای خۆتان مەکەن، هەروەها خوازبێنی لەسەر خوازبێنی براتان مەکەن، مەگەر ئەو برایەتان ڕێگەتان پێبدا.

**(٤٣) عن سمرة رضي الله عنه قال: نهى النبي ﷺ عن بيع الحيوان بالحيوان**

---

١ رواه البخاري ومسلم وأبوداود والترمذي والنسائي.

٢ رواه البخاري ومسلم وأبوداود والترمذي والنسائي.

٣ رواه البخاري ومسلم وأبوداود والترمذي والنسائي.

**نسيئة.** [1]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە فرۆشتنی گیانلەبەر بە گیانلەبەر (ئاژەڵ بە ئاژەڵ)، ئەگەر دەست بەدەست نەبێ (واتە گیانلەبەرێك بەدوو دروست نییە، ئەگەر دواخرێ بەڵام ئەگەر دەست بەدەست بێ قەیناکا).

**(٤٤) نهى النبيﷺ عن ربح ما لم يضمن.** [2]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە قازانجی هەر شتێك کە وەری نەگرتبێ (وەك ئەوە تۆ شتێك بکڕێ و هێشتا وەرت نەگرتبێ بیفرۆشیتەوە).

**(٤٥) نهى النبيﷺ أن يبيت الرجل وهو جنب حتى يتوضأ.** [3]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە کە پیاو بە لەش پیسی بێنێتەوە تا ئەو کاتەی دەستنوێژ دەشوات (مەبەستی پێغەمبەرﷺ ئەدەب و ڕەوشت بەرزییە، ئەوەتا عائیشە ڕەزای خوای لەسەر بێ دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ جەنابەتی دەهاتە سەر و لەپاشان دەخەوت و خۆی نەدەشوشت تا بەیانی). ئیبن ماجە و ئیمامی ئەحمەد گێڕاویانەتەوە.

---

١ رواه احمد : ١٢/٥ و ١٩ و ٢١ و ٢٢ و ٩٩، ٣١٠/٣، وابن ماجه: ٢٢٧٠، والترمذي وابوداود والنسائي.

٢ رواه ابن ماجة: ٢٨٨ ، التجارات ٢/ ٧٣٨.

٣ رواه الترمذي: حديث رقم (١٢٠) ٢٠٦/١ ، ومسند احمد ١٧/١ ، والبيهقي ٢٠٠/١

**(٤٦) نهى رسول الله ﷺ عن بيع الماء.** [١]

واته: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی فرۆشتنی ئاوی کردووە.

**(٤٧) نهى النبي ﷺ أن تخرج المرأة من بيت زوجها إلاّ بإذنه.** [٢]

واته: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لە ئافرەت کە بێ پرسی مێردەکەی لەماڵ بچێتە دەرەوە.

**(٤٨) نهى رسول الله ﷺ عن كسب الزمارة.** [٣]

واته: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە کە پارە بە ئافرەتی گۆرانیبێژ پەیدا بکرێت.

**(٤٩) نهى رسول الله ﷺ عن المطلقة أن تتزوج زوجاً آخر يُحلها للأول.** [٤]

واته: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لەو ئافرەتەی تەڵاق دراوە، شوو بکاتەوە بە یەکێکی تر تاوەکو حەڵاڵ بێتەوە بۆ پیاوی یەکەم (واتە مارە بەجاش) چونکە پێغەمبەر ﷺ نەفرینی کردووە لەم حاڵەتە، دەفەرمووێ: (لعن الله المُحلل والمحلل له) واتە: نەفرەتی خوا لەو کەسە بێ کە مارەبەجاش دەکا و ئەوەی بۆی حەڵاڵ دەکا.

---

١ رواه الترمذي رقم ١٢٧١ (٥٦٢/٣)، النسائي البيوع باب ٨٨ ، مجمع الزوائد ٢٧٥/١.

٢ فتح الباري: ٢/ ٣٤٧ و ٣٤٨.

٣ رواه ابوعبيدة والبيهقي بسند صحيح عن ابي هريرة ﷺ.

٤ رواه ابن ماجه : ١٩٣٦ ، مستدرك الحاكم ١٩٨/٢ و ١٩٩ ، الدار القطني ٤٥١/٣، البيهقي ٢٠٨/٧ باسناد صحيح.

**(٥٠) نهى النبيﷺ عن بيع ما ليس عنده.[١]**

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە فرۆشتنی شتێك کە لەلای نەبێت.

**(٥١) نهى رسول اللهﷺ عن شرطين في البيع.[٢]**

واته: پێغەمبەرﷺ دوو جۆرە مەرجی لە فرۆشتنی قەدەغە کردووە (وەك ئەوە تۆ بڵێی من ئەم ماڵەت دەدەمێ ئێستا بەوەندە، بەڵام بەقەرز دەتدەمێ بەوەندە، ئەمە بەپێی شەرع دروست نییە.

**(٥٢) نهى النبيﷺ عن بيع القردة وعن جلود القردة والخنازير.[٣]**

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە فرۆشتنی مەیمون و پێستەکەی و فرۆشتنی بەراز.

**(٥٣) نهى النبيﷺ عن اللعب بالحمام.[٤]**

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە یاریکردن بەکۆتر.

**(٥٤) نهى النبيﷺ أن يستنجي بيمينه.[٥]**

واته: پێغەمبەرﷺ ڕێگای نەداوە بە دەستی ڕاست خۆت پاك بکەیتەوە.

---

١ ابوداود للبيوع باب : ٧٠ ، الترمذي : ١٢٣٧ ، النسائي البيوع: ٦٠ ، ابن ماجة ٢١٨٧ ، مسند احمد ٣١/ ٤٠٢ ، فتح الباري ٣٤٩/٤ ، البيهقي ٢٦٧/٥ و٣١٧.

٢ شرح معاني الآثار : ٤ / ٤٦ .

٣ رواه البخاري: ١٠٨/٣ ، مسلم المساقات ٧١ ، الترمذي ١٢٩٧.

٤ رواه مسلم كتاب الطهارة ٥٧ ، و٥٩ ، وابوداود طهارة ٤ و ١٨ و ابن مالجة حديث ٣١٣.

٥ كشف الخفاء ٢ / ٢٠٣ .

**(٥٤) نهى رسول الله ﷺ عن نكاح الشغار.** [١]

واتە: پێغەمبەرﷺ ژن بەژنی قەدەغە کردووە.

**(٥٥) نهى رسول اللهﷺ ان بتوارث أهل الملتين.** [٢]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە موسڵمان میرات لـە کـافر بگرێـت و کافریش لە موسڵمان بگرێت.

**(٥٦) نهى رسول اللهﷺ عن الرُقية.** [٣]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی نوشتی و دوعاکردنی بـەهۆی (جـن) کـردووە (مەبەستی شتی بێشەرعی و تەڵسەم و مەندەل و...).

**(٥٧) نهى النبيﷺ أن تطيّب المرأة للمسجد.** [٤]

واتە:پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە کە ئافرەت کاتێـك دەچـێتە مزگـەوت بۆن لەخۆی بدات.

**(٥٨)نهى رسول اللهﷺ ان تمنع المرأة زوجها ولو كانت على قتب.** [٥]

واتە: پێغەمبـەرﷺ قەدەغـەی کـردووە کاتێـك پیـاو داوای سـەرجێی لـە خێزانەکـەی بکـات، ئـەویش قەدەغـەی بکـات، ئەگـەر لەسـەر پاشەڕۆکی ئاژەڵ بێت.

**(٥٩) نهى النبيﷺ عن بيع السفين.** [٦]

---

١ رواه مسلم: ٦٠ ، وابن ماجه : ١٨٨٣ ، ١٨٨٤ ، والنسائي: ٥٨ و٥٩ .

٢ رواه الترمذي: ٢١٠٨ ، وابوداود الفرائض ١٠ ، ابن ماجه ٢٣٣١.

٣ فتح الباري ١٥٥/١٠ و ١٥٦.

٤ رواه مسلم : ١٤١ .

٥ رواه الطبراني في الكبير ٤٠١/٩ ، وابن ماجه: ١٨٥٣ ، الترغيب والترهيب ٥٨/٣.

٦ رواه مسلم: ٣/ ١١٦٥ ، والترمذي: ١٢٢٦ ، والنسائي: ٢٨ ، وابوداود : ١٩.

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لەو جۆرە فرۆشتنە (وەك ئـەوە بڵێـی من بەری ئەو دارخورمایەت دەدەمـێ بەوەنـدە پـارەی تـا ئەوەنـدە ساڵە، ئەمە دروست نیە، چونکە پارەکـەی لێ وەردەگـرێ لەسـەر شتێکی نادیار نازانێ دەبێتەوە یان نا.

**(٦٠) نهى النبي ﷺ عن بيع الصنم.**[١]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە فرۆشتنی بت.

**(٦١) نهى رسول اللهﷺ عن اكل الربا.**[٢]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە خواردنی سوود(الربا)

**(٦٢) عن حكيم بن حزامرضي الله عنه قال: نهى رسول الله ﷺ أن يستقاد في المسجد وأن تنشد فيه الأشعار وأن تقام فيه الحدود.**[٣]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کرد کە لەناو مزگەوتدا بکـوژ بکوژرێتـەوە، با هۆنراوەو سرودی تیا بگوترێ و با حەد و حدودی خـوای گـەورەی تیا جێبەجێ بکرێ.

**(٦٣) عـن جابررضي الله عنه قـال: نهانـا النبـيﷺ يـوم الخيـبر عـن البغـال والحمير ولم ينهانا عن الخيل.**[٤]

واتە: پێغەمبەرﷺ لە رۆژی خەیبەردا ئێمەی قەدەغـە کـرد لـە خـواردنی گۆشتی هێستر و گوێدرێژ، بەڵام گۆشتی ئەسپ و ماینی لێ قەدەغە

---

١ رواه مسلم: ٧١ ، الترمذي ١٢٩٧ .

٢ رواه ابوداود والترمذي واحمد.

٣ رواه ابوةداود والترمذي بسند صالح.

٤ رواه مسلم وابوداود.

نەکردین.

**(٦٤) عن ابن عمر ﵄ قال: نهى النبيﷺ عن الجلالة والبانها.** [١]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لەسەرمان خواردنی گۆشت و شیری گیانلەبەری پیسخۆر.

**(٦٥) عن ابن عمر ﵄ قال: نهى رسول اللهﷺ عن الجلالة في الإبل أن يُركب عليها أو يُشرب من ألبانها.** [٢]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کرد کە سواری ووشتری پیسخۆر بین، یا لەگۆشت و شیری بخۆین.

**(٦٦) عن ثعلبة ﵁ ان النبيﷺ نهى عن اكل كُلّ ذي نابٍ من السباع وعن كلّ ذي مخلب من الطيور.** [٣]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە خواردنی گۆشتی هەر دڕندەیەك کە کەڵبەی هەبێت، یا هەر باڵندەیەك کە چنگ و چڕنووکی هەبێ.

**(٦٧) عن رافع بن خديج قال: نهى رسول اللهﷺ عن كراء الأرض، إمّا بالذهب والورق فلا بأس به.** [٤]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە کە زەوی بدرێت بە ملکانە، مەگەر بەزێڕ و زیو بە پارەیەکی دیاریکراو بەکرێ بدرێ ئەوە قەیناکا.

**(٦٨) عن علي ﵁ قال: ان النبيﷺ نهى عن المتعة وعن الحُمُر**

---

١ رواه ابوداود والترمذي والنسائي بسند حسن.

٢ رواه ابوداود والترمذي والنسائي بسند حسن.

٣ رواه البخاري ومسلم وابوداود والترمذي وانسائي.

٤ رواه البخاري ومسلم وابوداود والترمذي.

**الأهلية يوم خيبر.**[1]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە ڕۆژی غەزای خەیبەردا لە دوو شت: لە ژن مارەکردنی کاتی (کە لای شیعەکان ڕێ پێدراوە) و لە خواردنی گۆشتی کەری ماڵی.

**(٦٩) عن ام عطيبةرضي الله عنها قال: كنا ننهي ان نحدّ على ميت فوق ثلاث، إلا على زوج أربعة اشهر وعشراً ولا تكتحل ولا نتطيب ولا نلبس ثوباً مصبوغا إلاّ ثوب عصب، وقد رُخص لنا عند الطهر إذا اغتسلت إحدانا من حيضها في نبذة من كست أظفار.**[2]

واته: ئوم عەتیە دەفەرموێ: لێمان قەدەغەکراوە کە لە سێ ڕۆژ پتر تازیە (تازێ) بگرین بۆ مردوو، مەگەر بۆ مێرد، کە دەبێ چوار مانگ و دە شەو تازیە بگرین بۆی، وە لەو ماوەیەدا نابێ چاو برێژین، یان خۆمان بۆنخۆش بکەین، یا جلوبەرگی ڕەنگین لەبەر بکەین، مەگەر بەرگێك لەپێشدا ڕەنگکرابێ و لەپاشا چنرابێ، کاتێکیش کە پاك بووینەوە لە بێنوێژی کە ویستمان خۆمان بشۆرین ڕێگەی ئەوەمان دراوە کە بەقەد پێویست عود و گوڵاو و نەختێك بەکار بێنین.

**(٧٠) عن ابي سعيد الخدريرضي الله عنه: نهى رسول اللهﷺ عن اشتمال الصماء وأن يحتبى الرّجل ثوب واحد وليس على فرجه من**

---

١ رواه البخاري ومسلم وابوداود والترمذي والنسائي.

٢ رواه البخاري ومسلم وابوداود والنسائي.

شيء. [1]

واته: پێغەمبەری خواﷺ قەدەغەی کردووە لەوە کە مرۆڤ بەرەنگێ خۆی داپۆشێ بە پارچە جلێك کە نەتوانێ دەستی لەناوی دەربێنێ، وە لەو جۆرەش کە پیاو بە چیچکانەوە جلێك بئالێنێ بەخۆیەوە بەڵام شەرمگای خۆی بەهیچ دانەپۆشێ.

(٧١) عن ابن عمرﷺ قال: نهى النبيﷺ عن القزع. [2]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە قۆچکەتاش، واتە هەندێکی سەری منداڵ بتاشێ و هەندێکی بهێڵرێتەوە.

(٧٢) نهى النبيﷺ أن تحلق المرأة رأسها. [3]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە ئافرەت سەری خۆی بتاشێ.

(٧٣) عن عبدالله بن مغفلﷺ قال: نهى النبي ﷺ عن الترجل إلا غبا. [4]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە موشانەکردنی زۆر مەگەر، ناوبەناو بۆ پاکی و خاوێنی بێ و بۆ کەشخەیی و شەوق و کەیف نەبێ.

(٧٤) عن بريدةﷺ عن النبيﷺ قال: نهيتكم عن الظروف وإن

---

١ رواه البخاري، انظر فتح الباري ٢٧٩/١٠ ، المنهيات للإمام الترمذي ص ٦ .

٢ رواه البخاري ومسلم وابوداود والنسائي.

٣ رواه النسائي بسند صحيح.

٤ رواه ابوداود والترمذي والنسائي بسند صحيح.

**ظرفا لا يحل شيئا ولا يحرمه وكل مسكر حرام.** [1]

واته: من بەئێوەم گوتبوو کە لە هەندێ حاجەتدا شت مەخۆنەوە، بەڵام حاجەت خۆی لەخۆیا شت حەڵاڵ و حەرام ناکا، ئەوەندە هەیە کە هەموو سەرخۆشکەرێك حەرامە.

**(٧٥) عن انس بن مالك ﷺ قال: نهى نبي الله ﷺ ان يتزعفر الرجل.** [2]

واته: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە کە پیاو زەعفەران لەخۆی بدا یا لە جل و بەرگی (بەڵام بۆ ژن هەردولا دروستە).

**(٧٦) عن علي ﷺ قال: نهاني النبي ﷺ عن التختم بالذهب، وعن لباس القسيّ، وعن القرآءة في الركوع والسجود وعن لباس المعصفر.** [3]

واته: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد لێم ئەنگوستیلەی زێڕ لەدەست بکەم و، جلوبەرگی ئاوریشم لەبەر بکەم و، قورئان لەڕوکوع و کڕنووش دا بخوێنم و، جلوبەرگی عەصفەراناوی لەبەر بکەم.

**(٧٧)عن علي ﷺ قال: نهانی رسول الله ﷺ عن الخاتم في السبابة والوسطى.** [4]

واته: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد لێم ئەنگوستیلە لەم دوو پەنجەیە بکەم:

---

١ رواه مسلم والترمذي.

٢ رواه البخاري ومسلم وابوداود والترمذي والنسائي.

٣ رواه مسلم وابوداود والترمذي والنسائي.

٤ رواه مسلم والترمذي والنسائي.

قامکی ناوەڕاست و پەنجەی دۆشاومژە.

**(٧٨) نهی رسول اللهﷺ ان يُحرق شيء من الحيوان بالنار.** [(١)]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لەوەی کە لاشەی ئاژەڵ بە ئاگر بسوتێنی، وە لە ڕوایەتێکی تردا دەفەرمووێ: (لا تعذبوا بعذاب الله)، واتە ئەو ئاگرەی خوای پەروەردگار تاوانبارانی پێ دەسوتێنێ، ئێوە ئاژەڵان و ئادەمیزادەکان بە ئاگر مەسوتێنن.

**(٧٩) نهی رسول اللهﷺ أن يسل السيف في المسجد.** [(٢)]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لەوەی شیر هەڵبکێشین لەناو مزگەوت.

**(٨٠) نهی رسول الله ﷺ أن يدخل الحمام الا بمِئزر.** [(٣)]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوو لێمان کە ببێ (خاولی) یا پەشتەماڵ بچینە جێگای خۆشتن واتە گەمارو، کە بەبێ (کلاو یان مەندیل یا جامانە یا...) بچینە جێگای خۆیشتن (حمام).

**(٨١) نهی النبيﷺ أن يخلو الرجل بإمرأة غير محرم.** [(٤)]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە پیاو لەگەڵ ئافرەتێکی نامەحرەم بەتەنها بەیەکەوە بن.

**(٨٢) نهی النبيﷺ أن يأكل بشماله.** [(١)]

---

١ رواه ابوداود: باب الجهاد، شرح السنة: ١٩٨/١٢ ، مجمع الزوائد: ٢٥١/٦.
٢ مجمع الزوائد: ٢٥/٢.
٣ رواه احمد: ٣٢١/٢ ، موارد الظمآن : ٢٠٣٨ و ٢ز٥٣/ مجمع الزوائد ٢٧٠/١ .
٤ فتح الباري : ٧٢/٤ و ٤٨/٧ ، مسلم: حديث رقم ٤٢٤ .

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە بەدەستی چەپ خواردن بخۆین.

(٨٣) **نهى رسول الله ﷺ أن يباشر الرجل امرأته وهي حائض الا وبينهما ثوب.** [٢]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە پیاو بچێتە لای خێزانی کاتێك لە حەیزابێت، مەگەر ئافرەتەکە پەڕۆیەك لەسەر فەرجی دابنێت (ئەو کاتە دەتوانێ گەمەو یاری لەگەڵ بکەی، ماچ کردن و گەمەکردن لەگەڵ سینگی هەمووی ڕێگە پێدراوە، تەنها جیماع کردن نەبێ).

(٨٤) **نهى رسول الله ﷺ أن يبيت على سطح وليس يحبس قدميه بشيء دونه.** [٣]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لەوەی یەکێك لە شوێنێکی بەرز بێنێتەوەو قاچەکانی بە شتێك دەبەستێتەوە.

(٨٥) **نهى رسول الله ﷺ عن الخضاب بالسّواد.** [٤]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە یەکێك سەرو سمێڵ و ڕیشی سپی بووبێ بە بۆیە ڕەشی بکا.

(٨٦)**نهى رسول الله ﷺ عن الجرس.** [١]

---

١ رواه ابوداود : باب اللباس: ٤٣ ، ومسلم : حديث رقم ١٠٦ ، الترمذي : ١٧٩٩ ، مسند احمد : ٢/ ٨٠ و ٢ / ١٢٨.

٢ رواه ابوداود: كتاب الطهارة بسند صحيح.

٣ رواه ابوداود في الأدب: ١٠٣ ، الترغيب والترهيب : ٤ /٥٥ ، شرح السنة : ١٢ /٣٢٦.

٤ سنن النسائي باب الزينة : ١٥ .

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە دەنگی زەنگوڵ (لەبەر ئەوەی جن و شەیتانەکان پێیان خۆشە.)

(٨٧) **عن ابن عمر رضي الله عنه قال: نهى النبيﷺ أن يقرن الرجل بين التمرتين حتى يستأذن اصحابه.** [٢]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە کە پیاو دوو دەنک خورما پێکەوە بخوا، مەگەر هاوڕێکانی ڕێگای پێ بدەن.

(٨٨) **عن ابن عمر رضي الله عنه قال: نهى النبيﷺ عن الحنتم وهي الجرّة وعن الدُباء وهي القرعة، ومن المزّفت وهي المطلي بالقار، وعن النقير وهي النملة تنسح (أي تقشر) نسحا وتنقر نقراً، وامر أن ينتبذ في الأسقية.** [٣]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە خواردنەوەی خۆشاوی ئاو ئەم دەفرانە، چونکە زوو دەترشێن و توند دەبن و دەبن بە ئارەق: بەستوو، واتە کوپەڵە، کودی واتە کولەکە، زفت دراو، واتە شتێ بە زفت ڕووکەش کرابێ، کۆتکە: واتە بنکی دارخورما کە توێکڵەکەی پاك دەکەن و ناوەکەی هەڵدەکۆڵن، وە پێغەمبەرﷺ فەرمانی کرد کە خۆشاو لە کوندەو شتی وادا بکەن نەك لەو دەفرانەدا.

(٨٩) **عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه قال: نهى النبيﷺ عن لبس الحرير**

---

١ رواه مسلم: اللباس : ١٠٤ ، ابوداود: الجهاد: ٥١ ، النسائي الزينة: ٥٥ ، الترمذي: حديث رقم : ١٧٠٤ .

٢ رواه مسلم وابوداود والترمذي والنسائي.

٣ رواه مسلم والترمذي والبيهقي : ٨ ،٢٨٣.

**إلاّ موضع إصبعين او ثلاث او اربع.** [1]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە کە ئاوریشم لەبەر بکرێ، مەگەر بۆ نەخش، ئەویش بەقەد جێگەی دوو پەنجە یا سێ یا چوار.

**(٩٠)عن انس بن مالك رضي الله عنه قال: ان النبيﷺ نهى عن الشرب قائما، فقيل: الأكل؟ قال: ذاك اشدّ.** [2]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە خواردنەوەی (ئاوو شەربەت یا دۆشاوو....) بەپاوە (ڕاوەوستانەوە)، وە دەربارەی خواردن بەڕاوەستاویەوە چۆنە؟ فەرمووی خواردن خراپتر.

**(٩١) عن ابي سعيد الخدري رضي الله عنه أن النبي ﷺ نهى عن النفخ في الشراب، فقال رجلٌ: القذاة أراها في الإناء؟ قال: أحرقها، قال: فإني لا أروي في نفسٍ واحد؟ قال: فابن القدح عن فيك.** [3]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە کە لەکاتی شت خواردنەوەدا فووی لێبکرێ، پیاوێك گوتی: ئەی ئەگەر پوشکەیەکم بەسەر ئاوەکەوە لەناو جامەکەدا دی چی بکەم؟ فەرمووی: بەلێوی جامەکە بیڕێژە. گوتی: باشە ئەی ئەگەر بە یەك جار تێرم نەخواردەوە چی بکەم؟ فەرمووی: جامەکە لە دەمت دوور بکەرەوەو ئەوسا هەناسە بدە و دیسان بیخۆرەوە تا تێر دەخۆیتەوە.

---

١ رواه الشيخان واحمد ٩٢/٤ ، حلية الأولياء ١٧٧/٤ ، ٢٣٠/٩، مجمع الزوائد: ١٤١/٥.

٢ رواه مسلم والترمذي والطبراني باسناد حسن.

٣ رواه الترمذي وابوداود وابن ماجة: رقم ٣٢٨٨ ، مسند احمد ٣٠٩/١ و ٣٥٧ .

**(٩٢) عن ابي سعيد الخدري ﷺ قال: نهى النبيﷺ عن إختنا الأسقية.** [١]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لەوە کە دەن و هەنگلی کوندەو مەشکە هەڵپێچ بکرێ و ئینجا دەمی پێوە بنرێ و ئاوی لێ بخورێتەوە.

**(٩٣)نهى رسول اللهﷺ عن شريطة، الشيطان وهي التي تذبح فيُقطع الجلد ولا تفرى الأوداج ثم تترك حتى تموت، قيل: يا رسول الله، أما تكون الذكاة إلاّ في الحلق واللبة؟ قال: لو طعنت في فخذها لأجزأ عنك.** [٢]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە ملهەڵهێنانەوەی شەیتان، کە بریتی‌یە لەوە چەرمی ملی گیاندارەکە هەڵدەهێننەوەو پێست و گۆشتەکەی دەتەرەکێننەوە، بەڵام شادەمارەکانی ناقرتێنن ئیتر وازی لێ دێنن، یا دەمرێ و لەسەر ئەو ماڵە ئازارێکی زۆری دەبێ، گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی سەربڕین دەبێ هەر لە ئاستی قورقوڕاگەو لەبۆتەقەی مل دابێ؟؟ فەرمووی: ئەگەر تیغی بدەی لە ڕانیشی دەبێ.

**(٩٤) عن عليﷺ قال: نهى النبيﷺ أن يُضحى بعضباء الأذن والقرن.** [٣]

١ رواه البخاري ومسلم وابوداود والترمذي.
٢ رواه ابوداود والترمذي والنسائي بسند غريب.
٣ رواه ابوداود والنسائي بسند صحيح.

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە کە ئاژەڵی گوێ قرتاو و شاخ شکاو بکرێن بە قوربانی.

**(٩٥) عن ابن عمرؓ قال: نهى النبيﷺ عن مطعمتين: عن الجلوس على مائدة يُشرب عليها الخمر وعن الأكل وهم مُنبطح على وجهه.** [١]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە کە لەسەر ئەم دوو شێوەیە نان بخورێ: دانیشتن لەسەر سفرەیێ کە ئارەق لەسەری بخورێتەوە، هەروەها خواردن بە ڕاکشانەوە لە سەردەم.

**(٩٦) عن جابرؓ قال: نهى النبيﷺ عن أكل الهر وعن اكل ثمنه.** [٢]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە خواردنی گۆشتی پشیلەو خواردنی بەهاکەشی (واتە نرخەکەی).

**(٩٧) عن عبدالرحمن بن عثمانؓ قال: نهى النبيﷺ عن قتل ضفدع.** [٣] ، واتة: قيرة قيرى بؤق تةسبيحات كردنة.

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە کوشتنی بۆق، وە کاتێك قیڕەقیڕ دەکات ئەوە تەسبیحاتی خوای گەورە دەکات بەپێی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ کە دەفەرمووێ: ((.. فان نقيقها تسبيح)).

**(٩٨) عن ابن عباسؓ قال: نهى النبيﷺ عن قتل أربع من**

---

١ رواه ابوداود والنسائي بسند صحيح.

٢ رواه مسلم وابوداود والترمذي والنسائي

٣ رواه ابوداود والنسائي وأحمد بسند حسن.

**الدّواب: النملة والنحلة والهُدهُد والصُرد.** [1]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە کوشتنی ئەم چوار گیانلەبەرانە: مێروله و هەنگ و پەپوسلێمانکە و باشووکە.

**(٩٩) نهى رسول اللهﷺ عن قتل الخفاش، فإنه لما خرب بيت المقدس قال يا رب سلطني على البحر حتى أغرقهم.** [2]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە کوشتنی شەمشەمەکوێرە، چونکە کاتێك بەیتولمەقدیس وێران کرا گووتی: خوایە زاڵم بکە بەسەر دەریادا تا هەموویان نوقم بکەم.

**(١٠٠) عن جابرؓ قال: ان رسول اللهﷺ نهى عن قتل الكلاب، وقال: عليكم بالأسود البهيم ذي النقطتين فانه شيطان.** [3]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە کوشتنی سەگ و فەرمووی: سەگی ڕەشی سادەی قوتار مەکەن، کە دوو خاڵی سپی بەسەر چاویانەوەیە، چونکە ئەم جۆرە سەگانە شەیتانن.

**(١٠١) نهى رسول اللهﷺ عن صَبْر البهائم، أو جعلها غرضاً يُرمى، أو حبسها حتى تموت.** [4]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە کە گیانداران بکرێن بە نیشانەو

---

١ رواه ابوداود وأحمد بسند صحيح ٢٤٧/١ ، شرح السنة ٢٤١/١١ ، ابن ماجه ٣٢٢٤ .

٢ رواه البيهقي.

٣ رواه مسلم وابوداود والترمذي ولنسائي.

٤ رواه احمد وابن ماجة بسند صحيح.

تیرباران بکرێن، وه یان بەند بکرێن تا مردن.

**(١٠٢) نهى رسول اللهﷺ عن شرب من ثلمة القدح وأن ينفخ في الشراب.** [1]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغـەی کـردووه لـه خواردنـەوه بـه لێـوی کـەلایی شکاوی جامەوه (واته له دەمی دۆلکەوه) هەروەها هەناسـەی تێـدا بخۆنەوه.

**(١٠٣) عن ام عطية الأنصارية قالت: نهينا رسول اللهﷺ عن إتباع الجنائز..** [2]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردین دوای جەنازەی مردوو بکەوین (ئەمـە تایبەته به ئافرەتان).

**(١٠٤) قال رسول اللهﷺ: نُهيت أن أمشي عريانا.** [3]

واته: پێغەمبەر دەفەرموێﷺ: لێم قەدەغە کراوه بەڕووتی بەڕێگادا بڕۆم.

**(١٠٥) نهى رسول الله ﷺ أن تنكح المرأة على عمتها أو على خالتها.** [4]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووه لەوەی کە ئـافرەت بەسـەر خوشـکی دایك و خوشکی باوکدا مارەبکرێت.

**(١٠٦) عن ابي هريرةرضي الله عنه قال: كان النبيﷺ ينهى عن الحجامة**

---

١ رواه ابوداود بسند صحيح.

٢ رواه البخاري.

٣ رواه الشيخان وابوداود.

٤ رواه النسائي ومسلم والبخاري في فتح الباري ٩ / ١٦٠ .

**يوم الثلاثاء ويقول (انه يوم الدم وفيه ساعة لا يرقأ.** [1]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە خوێن بەردان لەڕۆژی سێشەممەدا، دەیفەرموو: چونکە سێشەم ڕۆژی خوێن ڕژانە وە کاتێکی تێدایە خوێنی تێدا ناوەستێ.

**(١٠٧) عن ابي هريرةرضي الله عنه قال: نهى النبيﷺ عن الدواء الخبيث.** [2]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە (خواردن و تیمارکردن) بە دەرمانی پیس.

**(١٠٨) عن ابن عمررضي الله عنه قال: أن رسول اللهﷺ نهى أن يسافر بالقرآن الى أرض العدو.** [3]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە کە قورئان ببرێ بۆ وولاتی دووژمن (لەترسی ئەوەی بکەوێتە ژێر دەستی دووژمن و بێحورمەتی بکا).

**(١٠٩) عن ابن عمررضي الله عنه قال: نهى رسول اللهﷺ عن قتل النساء والصبيان.** [4]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە کوشتنی ژن و منداڵ لەکاتی شەڕی کافراندا.

---

١ رواه ابوداود بسند حسن.

٢ رواه ابوداود والترمذي بسند صالح.

٣ رواه البخاري ومسلم وابوداود.

٤ رواه مسلم والبخاري والترمذي ١٥٥٨ ، البيهقي : ٣٧/٩ .

**(١١٠) عن عبدالله بن زيدﷺ قال: نهى النبيﷺ عن المثلة.** [١]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە کە گیاندار ئەتك بكرێت (وەك گوێ برین و لووت برین و چاو كوێر كردن و..هتد.)

**(١١١) نهى رسول الله ﷺ أن يُنفخ في الصلاة.** [٢]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لەناو نوێژدا فوو لە شت بكرێت.

**(١١٢) نهى رسول اللهﷺ عن الصلاة الى موضع حُش**[*] **أو حمام أو مقبرة.** [٣]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە نوێژكردن لەم شوێنانە: ١- جێگای پیسایی كردن ٢-جێگای خۆشتن، ٣- سەرقەبران.

**(١١٣) نهى رسول اللهﷺ عن أربع من الأسماء يسار ونافع وبركة ورافع.** [٤]

واته: پێغەمبەرﷺ ئەم چوار ناوەی قەدەغەكردووە: (یسار-نافع- بركە- رافع).

---

١ رواه البخاري، كنز العمال ١١٠٦٨ .

٢ رواه الترمذي: رقم ٣٨١ بسند حسن.

(*) حش: گیا، باغ وێستان، شوێنی پیسایی كردن.

٣ رواه الترمذي: رقم ٣١٧ ، ابوداود: باب الصلاة ٣٤ ، ابن ماجة : ٧٤٥ ، مستدرك الحاكم : ١/ ٢٥١ ، فتح الباري : ١/ ٥٢٩.

٤ رواه ابوداود: باب الأدب ٦٩ ، الترمذي : ٢٨٣٦ ، مسلم: الأدب ١٢ ، شرح السنة: ٣٣٨/١٢ ، مسند أحمد : ٥ / ١٠ و ١١ .

**(١١٤) نهى رسول الله ﷺ أن يحرش بين البهائم.** [١]

واته: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لە بەشەڕهێنانی گیانداران (وەك شەڕە کەو یا شەڕە گەڵەشێر یا شەڕە مریشك یا شەڕە سەگ).

**(١١٥) نهى رسول الله ﷺ عن التثاؤب في الصلاة.** [٢]

واته: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لەوەی لەناو نوێژدا باووشك بێتەوە.

**(١١٦) نهى رسول الله ﷺ أن يقول الرجل لا وأبيك أو يقول لا والكعبة وحياتك وحياة فلان.** [٣]

واته: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لەوەی سوێند بەسەری باوك بخورێت یا بڵێ بە مەککە یا بەژیانی تۆ (یا گیانی تۆ) یا بە ژیانی فلان (بۆیە پێغەمبەر ﷺ بە شیرکی داناوە (من حلف بغير الله فقد أشرك)).

**(١١٧) نهى رسول الله ﷺ أن ينحى رجل للرجل أو يسجد لأحد غير الله.** [٤]

واته: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لە پیاو سوژدە و رکوع بۆ پیاو ببا.

---

١ رواه البيهقي : ١٠ / ٢٢ ، ابوداود: حديث رقم ٥١ ، الترمذي: باب الجهاد ٣٠ ، الطبراني في الكبير: ١١ / ٨٥ .

٢ شرح السنة: ٣١٥/١٢ ، البخاري: حديث رقم ٩٤٩ ، فتح الباري : ١٠ / ٦١٢ ، عبدالرزاق: ٣٣٢٥ ، مسلم: الزهد ٥٩ ، مسند أحمد : ٣ / ٣٧ .

٣ رواه البخاري: ٥٣/٥ و ١٦٨/٨ ، بلفظ (لا تحلفوا بآبائكم ولا أمهاتكم)، وابوداود: الإيمان ٥ ، والنسائي: باب الإيمان والنزود ٦ ، البيهقي: ١٠ / ٢٩.

٤ شرح السنة: ٩/ ١٥٨ ، مسند أحمد: ٥ /٢٢٧ و ٢٢٨ .

**(١١٨) نهى رسول الله ﷺ أن تباع الشاة باللحم.**[١]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە ئاژەڵ بە گۆشت بفرۆشرێت یا بە پێچەوانەوە.

**(١١٩) نهى رسول اللهﷺ أن تحوّل شيء من تخوم الأرض، قال ومن فعل ذلك فعليه لعنة الله.**[٢]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لەوەی سنوری زەوی بگۆڕێ (مەبەست سنور گۆڕین یا داگیرکردن یا..) نەفرینی خوا (لعنە) لەو کەسە بێ ئەو کارە بکا.

**(١٢٠) نهى رسول الله ﷺ عن بيع السمكة بالماء.**[٣]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لەوەی ماسی لەناو ئاودا بفرۆشرێت.

**(١٢١) عن عبداللهرضي الله عنه قال: كان نبي الله ﷺ يكره عشر حلال: الصُفرة وتغير الشيب وجرّ الإزار والتختم بالذهب والتبرج بالزينة لغير محلها، والضرب بالكعاب والرُقى الا بالمعوّذات، وعقد التمائم، وعزل الماء عن محله، وفساد الصبي غير محرمة.**[٤]

واتە: پێغەمبەرﷺ حەزی لەم دە شتە نەبوو: ڕەنگە زەرد و ڕەنگی سوور لەخۆدان، گۆڕینی نیشانەی پیری، بەڕەش کردنی مووە سپیەکان یا

---

١ رواه الحاكم وقال البيهقي اسناده صحيح.

٢ مجمع الزوائد : ٤ / ١٦٠ ز ١٧٦ .

٣ مسند أحمد : ١/ ٣٨٨ ، البيهقي : ٥ ، ٣٤٠ .

٤ رواه ابوداود والنسائي بسند صالح.

به هەڵکەندنیان و، بە درێژکردنەوەی جل و بەرگ بەسەر زەویدا بۆ دەعیە و فیز، لە پەنجەکردنی ئەنگوستیلەی زێڕ و، خۆ ڕازاندنەوەیەك کە لە جێگای خۆی نەبێ (وەك خۆ جوانکردن بۆ پیاوی بێگانە یا ...) تاوڵەبازی و، نووشتەکردن، مەگەر بەو شتانە بێ کە دەبێتە پارێزگاری پەناگە، چاوەزار و موفەڕك هەڵگرتن و خۆکێشانەوەی پیاو لەکاتی جووت بوون لەگەڵ خێزانیدا تا ئاوەکە نەگاتە جێگەی خۆی (واتە ناو ڕەحم)، شفتەژێ کە دەبێتە هۆی خراپ بوونی شیری دایك بۆ منداڵەشیرەخۆرەکەی.

**(١٢٢) عن عمران بن حصين ﷺ قال: نهى النبي ﷺ عن الكي فأكتوينا فما أفلحنا ولاّ انجحنا.**[١]

واتە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لە خۆ داخ کردن (لەکاتی نەخۆشیدا)، وە ئێمە خۆمان داخ کرد، هیچ سوودمان لێ نەبینی و سەرکەوتوو نەبووین.

**(١٢٣) عن ابي امامة ﷺ قال: نهى النبي ﷺ عن عشر: عن الوشر، والوشم، والنتف، وعن مكامعة الرجل للرجل بغير شعار، ومن مكامعة المرأة المرأة بغير شعار، وأن يجعل الرجل في اسفل ثيابه حريرا مثل الأعاجم، أو يجعل على منكبيه حريرا مثل الأعاجم، وعن النهبى وركوب النمور ولُبُوس الخاتم إلا لذي سلطان.**[٢]

---

١ رواه مسلم وابوداود.

٢ رواه النسائي بسند ضحيح.

واتە: پێغەمبەرﷺ ئەم دە شتەی قەدەغە کردووە: ڕنین و شاش کردنی ددان و خاڵکوتـان و قـژ ڕنینـەوەو مـووی سـپی بـژاردن و دەرهێنـان و، ڕاکێشانی پیاو لە تەنیشت پیاو بەڕووتی و ڕاکشانی ئافرەت لەگـەڵ ئافرەت بەڕووتی و ئەوەیش کە پیـاو چـاك و دامـێن و سەرشـانەی جلەکانی بگرێتـە ئاوریـشم، تـاڵان و بـڕۆ و، سـواربوونی پڵـنگ و ئەموستیلە لەدەست کردن، مەگـەر بـۆ پیـاوی خـاوەن دەسـەڵات و فەرمانڕەوا.

**(١٢٤) نهى رسول اللهﷺ أن تصل المرأة بشعرها شيئا.** [١]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە ئافرەت شتی تـر لـە پرچـی خۆیـدا، (ئەمە کەزی ناگرێتەوە).

**(١٢٥) عن جابرt قال: نهى رسول اللهﷺ عـن الضرب في الوجه وعن الوسم فيه.** [٢]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە کە لە ڕووخساری گیاندار بـدرێ، یـا ڕووخساری گیاندار داخ بکرێ بۆ نیشانەکردن.

**(١٢٦) نهى النبـيﷺ أن يُستأجر اجيراً قبل ان يُعلمه اجره.** [٣]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە یەکێك بەکرێ بگریـت و کرێیەکـەی خۆی نەزانێ چەندە.

**(١٢٧) نهى النبـيﷺ أن يُمنع جاره أن يغرز خشبة في حائطه.** [١]

١ رواه مسلم.

٢ رواه مسلم والترمذي.

٣ مجمع الزوائد : ٤/ ٩٧ ، مسند أحمد : ٣ / ٥٩ و ٦٨ و ٧١ .

واتە: پێغەمبەرﷺ ڕێگای نەداوە دراوسێیەکەی قەدەغە بکا لە دارێك کە هاتبێتە سەر دیواری یا خۆیان لەسەر دیواری ئەوانیان دانابێ.

**(١٢٨) نهى رسول اللهﷺ عن الآذان بالأجر.** [٢]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە کرێی بانگدان.

**(١٢٩) نهى النبي ﷺ عن بيع الذهب بالفضة نسيئة.** [٣]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە فرۆشتنی زێڕ بەزیو ئەگەر دەست بەدەست نەبێ.

**(١٣٠) نهى رسول اللهﷺ عن بيع الذهب بالذهب إلا وزنا بوزن سواء بسواء.** [٤]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە فرۆشتنی زێڕ بەزێڕ مەگەر لەکێشاندا وەکو یەك بن (ئەوا قەیناکا).

**(١٣١)عن عائشة رضي الله عنها قالت: كان رسول الله ﷺ ينهى عن عقب الشيطان وعن فرشة السبع..** [٥]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی دەکرد لە قنگەڵتس لە تەحیاتا، وە قەدەغەی دەکرد لە ڕاخستنی هەردوو باڵ لەسەر زەوی.

---

١ مسند أحمد : ٢ / ٢٧٤ ، الدار قطني : ٤ / ٢٢٨ ، البيهقي: ٦، ٦٨ و ٦٩ - ارواء الغليل : ٥ / ٢٥٤.

٢ رواه الترمذي: ٢٠٩ ، ابوداود: باب الصلاة ٤٠ ، النسائي: الآذان ٢٩ ، البيهقي: ١/ ٤٢٩ ، مستدرك الحاكم : ١ / ١٩٩.

٣ فتح الباري : ٤ / ٣٨٣ ، مسلم المساقات: ٨٧.

٤ فتح الباري : ٤ / ٣٧٩ ، مسلم المساقات: ٧٦ و ٨٤ .

٥ رواه مسلم وابوداود.

**(١٣٢) عن ابن عمر رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ نهى أن يصلي في سبعة مواطن: في المزبلة والمجزرة والمقبرة وقارعة الطريق وفي الحمام ومعاطن الإبل وفوق ظهر بيت الله الحرام.** [1]

واته: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لە نوێژکردن و نوێژ بەجێهێنان لە حەوت شوێندا: لەو شوێنەی زبڵ و شتی پیسی لێ فڕێ ئەدرێ و قەسابخانە و گۆڕستان و سەرەڕێ و گەرماو و مۆڵگەی سەر سەرچاوەی ئاوخواردنەوەی وشتر و سەربانی کەعبەی پیرۆز.

**(١٣٣) عن أم عطية رضي الله عنها قالت: نهينا عن اتباع الجنائز..** [2]

واته: ئێمە ئافرەتان لێمان قەدەغە کراوە دوای تەرم بکەوین بۆ سەر گۆڕستان.

**(١٣٤) عن جابر رضي الله عنه قال: نهى رسول الله ﷺ أن يجصص القبر وأن يقعد عليه وأن يُبنى عليه.** [3]

واته: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لە گەچ کاری کردنی گۆڕ و دانیشتن لەسەر گۆڕ و خانوو دروست کردن لەسەر گۆڕ.

**ولفظ الترمذي : نهى النبي ﷺ أن تجصص القبور وأن يُكتب عليها وأن يُبنى عليها وأن توطأ.**

واته: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لە گەچ کاری کردنی گۆڕ و لە نووسین لەسەری و لە دروست کردنی خانوو لەسەری و لە شێلان و پێلێنانی.

---

١ رواه الترمذي.

٢ رواه البخاري ومسلم والنسائي.

٣ رواه مسلم وابوداود والترمذي والنسائي وابن ماجه.

**(١٣٥)عن عبدالله بن سرجس ان النبيﷺ نهى أن يبال في الجُحر، قالوا لقتادة ما يكره من البول في الجُحر؟ قال: كان يُقال: إنها مساكن الجن.** [1]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە کە میز بکرێتە ناو کونی زەوییەوە. گوتیان بە قەتادە: بۆچی باش نییە کە میز بکرێتە ناو کونی زەوییەوە؟ فەرمووی: دەڵێن: جێگەو لانەی جنۆکەیە.

**(١٣٦) عن عائشةرضي الله عنها ان رسول اللهﷺ نهى عن دخول الحمامات ثم رخص للرجال أن يدخلوها في الميازر.** [2]

واته: پێغەمبەرﷺ لەسەرەتادا قەدەغەی کرد بچینە ناو گەرماوەکان، بەڵام لە دواییدا ڕێگەی بەپیاواندا کە بچن بۆ حەمام بەمەرجێ لەوێ پەشتەماڵ بگرنەوە بە ناوەندی ناوك و ئەژنۆیان.

**(١٣٧) عن ابن عباسرضي الله عنهما قال: أن النبيﷺ نهى عن الصلاة بعد الصبح حتى تشرق الشمس وبعد العصر حتى تغرب.** [3]

واته: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە نوێژ کردن دوای نوێژی بەیانی تا خۆرهەڵدێت، (مەبەست نوێژی سوننەتە)، وە لە دوای نوێژی عەسر تا خۆر ئاوابوون (ڕێگەی کردنی نوێژی سوننەتی نەدەدا).

**(١٣٨) كره النبيﷺ الصلاة نصف النهار إلا يوم الجمعة فإن جهنم**

---

١ رواه ابوداود والنسائي بسند جيد.

٢ رواه ابوداود والترمذي بسند حسن.

٣ رواه الشيخان والوداود والترمذي والنسائي.

**تسخر إلا في يوم الجمعة.**[1]

واتە: پێغەمبەرﷺ نوێژکردنی لە ناوەڕاستی ڕۆژدا پێ ناخۆش بوو، جگە لە ڕۆژی هەینی، چونکە لە هەموو ڕۆژێ لە ناوەڕاستی ڕۆژدا دۆزەخ دادەخرێ و گەرم دەکرێ تەنیا ڕۆژی هەینی نەبێ.

**(١٣٩) عن علي بن أبي طالبرضي الله عنه قال: نهاني حبيبي رسول اللهﷺ أن أقرأ القرآن راكعا أو ساجداً.**[2]

واتە: پێغەمبەری خۆشەویستم قەدەغەی کردم کە لەناو ڕکوع (چەمینەوە) و کڕنووشدا (سجود) قورئان نەخوێنم.

**(١٤٠) عن ابي هريرةرضي الله عنه قال: نهى النبيﷺ أن يُصلي الرجل مُختصرا.**[3]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە کە پیاو لەنوێژدا دەست لەسەر کەلەکەی دابنێ.

**(١٤١) عن ابي هريرةرضي الله عنه قال: ان رسول اللهﷺ نهى عن السدل في الصلاة وأن يُغطي الرجل فاه.**[4]

واتە: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە شۆڕکردنەوەو خشاندنی جل و بەرگ بەسەر زەویدا لەناو نوێژدا، هەروەها لەوەش کە پیاو لەکاتی نوێژکردندا بە لفکەی مێزەر و شتی وا دەمی خۆی هەڵپێچێ.

---

١ رواه الترمذي.

٢ رواه مسلم وابوداود والنسائي والترمذي وابن ماجه.

٣ رواه الشيخان وابوداود والترمذي والنسائي.

٤ رواه ابوداود والترمذي.

لەخوای پەروەردگار دەپاڕێمەوە کە ئەم کارەم لێ وەربگرێ و بیکاتە توێشووی ڕۆژی دوایی، وە داوا لە خوێنەرانی ئەم نامیلکەیە داوا دەکەم، دوعای خێرم بۆ بکەن و لە هەڵەو کەم و کورتییەکان ئەگەر بەرچاوتان کەوت چاوپۆشیم لێ بکەن. خودا پاداشتی هەموو لایەك بداتەوە.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

سبحان ربك رب العزة عما يصفون.

والسلام على المرسلين. والحمد لله رب العالمين.

١٤٢٣ کۆچی

٢٠٠٣/٣/٧ زاینی

هەولێر- باداوە-




پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ:
((ما نهيتكم عنه فاجتنبوه
وما امرتكم به فأتوا منه ما استطعتم))
البخاري ومسلم.

لەم فەرموودە پیرۆزەدا پێغەمبەر ﷺ
داوا لەهەموو موسڵمانان دەکا
ئەوەی من قەدەغەم کردووە نەیکەن
وە ئەوەی منیش داوام لێکردن
جێ بەجێی بکەن،



بڵاوکراوەی کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بڵاوکردنەوە
٠٦٦ ٢٢٢٣٨٦٨
عێراق - کوردستان - هەولێر